# چل فەرموودەی مرواری لە

# صحيح البخاري

## باس و خواسەکانی تەوحید

کۆکردنەوە و شیکردنەوەی

مەبەست کاژاوی





بسم الله الرحمن الرحيم

# چل فەرموودەی مرواری لەصحيح البخاري

## باس و خواسەکانی تەوحید

مەبەست کاژاوی

١٤٤٤هـ

# پێشەکی

سوپاس وستایش بۆ پەروەدگاری جیهانیان، دروستکاری زەوی ئاسمانەکان، وپەرستراوی بەحەقی جنۆکە ومرۆڤەکان، صەڵات وسەلامی بێ پایان بڕژێت بەسەر سەرداری پێغەمبەران محمد و تەواوی هاوەڵان وشوێنکەوتوانیان هەتا ڕۆژی پەسڵان.

خۆشەویستەکانم ئاشکرایە کە ئیمان وتەوحیدێکی پاك لە ژەنگ وژاری کوفر وشیرکەکان بناغە وبنچینەیە بۆ وەرگیرانی کردەوەکان لای خوای میهرەبان.

هەر لەم پێناوەشدایە زانایانی ئیسلام هەستاون بە نووسینی کتێبەکان لەباس وخواسەکانی تەوحید وئیمان.

وەك شوێنکەوتنێك بۆ پێشینان کە لە زۆر باس وبابەتدا چل فەرموودەیان نووسیوە، هەستاوم بە هەڵگۆزینی چل فەرموودەی پێغەمبەرمان لە کتێبە بەپێزەکەی صحيح البخاري لە باس وخواسەکانی تەوحید وئیمان لە پێناو ئەوەی ببێتە چرایەکی ڕۆشن بۆ فکر ودڵی فێرخوازانی زانستە شەرعیەکان.

هەستاوم بە کوردی کردنی فەرموودەکان پاشان هەڵگۆزینی سوودە هەڵبژێردراوەکان لە پێناو زیاتر تێگەیشتن وڕۆشنکردنەوەی بابەتەکان، بەو هیوایەم ببێتە جێگای سوود بۆ دۆستان وخۆشەویستان وجێگای ڕەزامەندی خوای میهرەبان.

**مەبەست کاژاوی**
**١٧ ربيع الأول ١٤٤٤هـ**
**١٣ أكتوبر ٢٠٢٢ م**

# فەرموودەی (١)

عن ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: لَمَّا بَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ مُعَاذًا نَحْوَ الْيَمَنِ، قَالَ لَهُ: (إِنَّكَ تَقْدَمُ عَلَى قَوْمٍ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ، فَلْيَكُنْ أَوَّلَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَى أَنْ يُوَحِّدُوا اللَّهَ تَعَالَى، فَإِذَا عَرَفُوا ذَلِكَ، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي يَوْمِهِمْ وَلَيْلَتِهِمْ، فَإِذَا صَلَّوْا، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ زَكَاةً فِي أَمْوَالِهِمْ، تُؤْخَذُ مِنْ غَنِيِّهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فَقِيرِهِمْ، فَإِذَا أَقَرُّوا بِذَلِكَ، فَخُذْ مِنْهُمْ، وَتَوَقَّ كَرَائِمَ أَمْوَالِ النَّاسِ). (رواه البخاري: ٧٣٧٢)

## واتای فەرموودەکە:

ئیبن عەبباس -ڕەزای خوای لێبێت- دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ موعاذی نارد بەرەو یەمەن پێی فەرموو: بێگومان تۆ دەچیت بۆ ناو خەڵکانێك کە خاوەنی کتێبی ئاسمانین بۆیە یەکەم شتێك کە بانگەوازیان بکەی بۆی با تەوحید بێت، کە تەوحیدیان ناسی وبوونە هەڵگری، ئینجا هەواڵیان پێبدە کە پەروەردگار پێنج نوێژی لە شەو ورۆژێکدا لەسەر پێویست کردوون، کە دەستیان کردە نوێژکردن، ئینجا فێریان بکە کە پەروەردگار زەکاتی ماڵ و سامانەکانیان لەسەر پێویست کردووە، لە دەوڵەمەندە کانیان وەردەگیرێت ودەدرێتە هەژارەکانیان، کە دانیان بەوەدانا لێیان وەربگرە، بەڵام خۆت بەدووربگرە باشترینی ماڵەکان وەربگرن بۆ زەکات.

## سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- لە پێشترین وگرنگترین شتێك کە خەڵکی بۆ بانگبکرێت تەوحید و تێگەیاندنیانە کە چۆن یەکخواپەرست بن، و دەستبەرداری طاغوت وپەرستراوەکان ببن جگە لە الله.

٢- دووەم پایەی ئیسلام کە جیاکەرەوەی نێوان موسوڵمان وغەیرە موسوڵمانە نوێژە، بۆیە لە دوای تەوحید گرنگترین شتە کە خەڵکی بۆ بانگبکرێت.

٣- تەوحید و نوێژ وزەکات ڕێکخستن وڕێکردنی نێوانی بەندەکان وخالقیان ونێوان خۆیانە، بەمەش تەواوی ژیانی خەڵك لەسەر ڕاڕەوێکی ڕێك ودروست دەڕوات وکەمترین تاوان وقەیران تووشی گەلێك دەبێت کە بەجوانی ڕاگری ئەم سێ پایە گرنگەی ئیسلام بن.



## فەرموودەی (٢)

عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ : (يَـا مُعَاذُ، أَتَدْرِي مَا حَقُّ اللَّهِ عَلَى الْعِبَادِ؟. قَالَ : اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ : أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلَا يُشْـرِكُوا بِهِ شَيْئًا، أَتَدْرِي مَا حَقُّهُمْ عَلَيْهِ ؟. قَالَ : اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ : أَنْ لَا يُعَذِّبَهُمْ).( رواه البخاري: ٧٣٧٣)

### واتای فەرموودەکە:

لە موعاذی کـوڕی جەبەل ــەوە هاتـووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی موعاذ ئـایا دەزانی مافی الله چیە بەسەر بەندەکانەوە؟
موعـاذ فـەرمـووی: خـوا وپێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مافی الله بەسەر بەندەکانەوە ئەوەیە کە بیپەرستن بە تاك وتەنها وشەریکی بۆ بڕیار نەدەن.
فـەرمـووی: ئـەی ئایا دەزانیت مافی بەندەکان لای الله چیە کاتێك ئەوان مافی الله بدەن؟
موعاذ فەرمووی: خوا وپێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن.
پێغەمـبەری خوا ﷺ فەرمووی: مافـی بەنـدەکان ئەوەیە کە سزایان نەدات.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- تەوحید ویەکخواپەرستی گەورەترین ماف وحەقی خوایە بەسەر بەندەکانە کە دەبێت جێبەجێکاری بن.

٢- ئەوەی ڕاگری تەوحید بوو گەورەترین ماف وحەقی الله داوە بۆیە پەروەردگار چاو پۆشی دەکات لە کەم وکوڕیەکانی تریان.

٣- هەر کەسێك بە کوفر وشیرکەوە مرد ماف وحەقی گەورەی خوای پێشێل کردووە وسزای هەتایی دۆزەخ جێگایەتی.

٤- گەورەترین زانستێك کە موسوڵمان بۆی نیە جەهلی بەرامبەر هەبێت تەوحید وچۆنێتی هەڵگرتنی تەوحیدە.

٥- فێرکردن بە شێوازی پرسیار ووەڵام باشترین شێوازی فێرکردنە.

٦- ئەدەب وڕێزی قوتابی عیلم بەرامبەر مامۆستاکەی وخاکی بوون بەرامبەری وبەئەدەبەوە وەڵامدانەوەی مامۆستاکەی.



## فەرموودەی (٣)

عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَـالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : ( لَا يَرْحَمُ اللَّهُ مَنْ لَا يَرْحَمُ النَّاسَ ).( رواه البخاري: ٧٣٧٦)

### واتای فەرموودەکە:

لە جەریری کوڕی عبداللە وە هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: اللە ڕەحم بەکەسێك ناکات کە ڕەحم وسۆزی بەرامبەر خەڵکی نەبێت.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- خوای پەروەردگار خاوەنی سیفەتی ڕەحم وبەزەییە بەرامبەر بەندەکانی بەگشتی وبەرامبەر ئیمانداران بەتایبەتی.

٢- ڕەحم وسۆز ودڵنەرمی بەرامبەر خەڵکی سیفەت وڕەوشتێکی جەخت لێکراوە وئەهلی تەوحید دەبێت هەڵگری بن.

٣- موسوڵمان نابێت جگە لە ڕەحم وسۆز بەرامبەر موسوڵمان وئەهلی ئیمان هیچ ڕق وبوغز وکینێك لە دڵیدا هەبێت.

٤- ڕق وبوغز بەرامبەر ئەهلی ئیسلام وتەوحید سیفەتی منافقین وئەهلی کوفرە، دڵی موسوڵمان خاڵیە لێی.

٥- سیفەتی ڕق وبوغز لە دڵی ئەهلی ئیماندا تایبەتی ئەهلی کوفر وشیرکە بەتایبەتر ئەوانەی کە دژایەتی ئیسلام وموسوڵمانان دەکەن.

٦- ئەوەی ڕەحم وسۆز لە دڵەکەیدا نەبێت، ڕەحم و میهرەبانی اللە شمولی ناکات ونایگرێتەوە.

# فەرموودەی (٤)

عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (مَفَاتِيحُ الْغَيْبِ خَمْسٌ لَا يَعْلَمُهَا إِلَّا اللَّهُ: لَا يَعْلَمُ مَا تَغِيضُ الْأَرْحَامُ إِلَّا اللَّهُ، وَلَا يَعْلَمُ مَا فِي غَدٍ إِلَّا اللَّهُ، وَلَا يَعْلَمُ مَتَى يَأْتِي الْمَطَرُ أَحَدٌ إِلَّا اللَّهُ، وَلَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِلَّا اللَّهُ، وَلَا يَعْلَمُ مَتَى تَقُومُ السَّاعَةُ إِلَّا اللَّهُ). (رواه البخاري: ٧٣٧٩)

## واتای فەرموودەکە:

ئیبن عومەر -رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا- دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی: کلیلەکانی غەیب وپەنهانی کە کەس زانستی دەربارەیان نیە جگە لە الله پێنجن: کەس نازانێت ئەوەی لەناو ڕەحمی دایکدا شاردراوەتەوە چیە وکێیە، وە سبەینێ چی ڕوودەدات، وە چ کاتێك بارانی بەسوود دێت، وە نەفسەکان لەچ شوێنێکدا دەمرن، وە چ کاتێك قیامەت بەرپا دەبێت.

## سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- لە تەواوێتی تەوحید ئەوەیە بیروباوەڕت وابێت کەس غەیب نازانێت جگە لە الله نەبێت.

٢- پەروەردگار زانستی تەواوی بە ڕابردوو وە داهاتوو هەیە، وهیچ شتێك نیە لە گەردووندا ڕووبدات زانستی تەواوی پێشوەختەی دەربارەی نەبێت.

٣- لێکدانەوەی (مَا تَغِيضُ الْأَرْحَامُ) بەوە کە کەس نازانێت منداڵی ناو ڕەحم کوڕە یان کچە لێکدانەوەیەکی کرچ وکاڵە، بەڵکو بەواتەی ئەوە دێت چی

وكێی تیدایە وچ كەسایەتیەك لەناو ئەم ڕەحمەدایە وچی دەردەچێت، بێگومان ئەمە زانستی پەنهانە وكەس پەی پێ نابات، بەڵام زانینی جنسی منداڵ دوای دروست بونی بەهۆی سۆنەر یان زانستەكانی ترەوە بابەتێك نیە بچێتە ناو غەیبیاتەوە.

**٤-** لێكدانەوەی دروست بۆ (لَا يَعْلَمُ مَتَى يَــأْتِي الْمَطَرُ أَحَدٌ إِلَّا اللَّهُ) واتە: كەس نازانێت كەی بارانی بەسوود دەبارێت بۆ خەڵك، وە بەڕاست دەرچوونی پێشبینیەكان بۆ باران بارین پێچەوانەی فەرموودەكە نیە.

**٥-** كەس نازانێت قیامەت كەی بەرپا دەبێت، بەڵام نیشانەكانی نزیكی هاتن وبەرپابوونی ڕۆشنكراوەتەوە.



## فەرموودەی (٥)

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (يَقْبِضُ اللَّهُ الْأَرْضَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَيَطْوِي السَّمَاءَ بِيَمِينِهِ، ثُمَّ يَقُولُ: (أَنَا الْمَلِكُ، أَيْنَ مُلُوكُ الْأَرْضِ؟). (رواه البخاري: ٧٣٨٢)

### واتای فەرموودەکە:

ئەبی هورەیرە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: خوای پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا زەوی دەگرێت، وئاسمانەکان بەدەستی ڕاستی دەپێچێتەوە، پاشان دەفەرموێت: من پاشا ودەسەڵاتداری هەموو جیهانم، لە کوێن پاشاکانی دونیا؟.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- پەروەردگار خاوەنی دوو دەستی حەقیقی خۆیەتی کە لائقە لەگەڵ گەورەیی وبەرزێتی خۆیدا وبەهیچ شێوەیەك لە دەستی دروستکراوەکانی ناچێت.

٢- دەسەڵاتداری ڕەها وپاشای گەردوون تەنها زاتی الله یە، وهەموو دەسەڵات وهێزی پاشاکان کاتین وکۆتاییان پێ دێت.



## فەرموودەی (٦)

عَنْ أَنَسٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (لَا يَزَالُ يُلْقَى فِيهَا، وَتَقُولُ: هَلْ مِنْ مَزِيدٍ؟ حَتَّى يَضَعَ فِيهَا رَبُّ الْعَالَمِينَ قَدَمَهُ، فَيَنْزَوِي بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ، ثُمَّ تَقُولُ: (قَدْ قَدْ، بِعِزَّتِكَ وَكَرَمِكَ. وَلَا تَزَالُ الْجَنَّةُ تَفْضُلُ حَتَّى يُنْشِئَ اللَّهُ لَهَا خَلْقًا، فَيُسْكِنَهُمْ فَضْلَ الْجَنَّةِ).(رواه البخاري: ٧٣٨٤)

### واتای فەرموودەکە:

ئەنەس لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: بەردەوام خەڵك دەخرێتە ناو دۆزەخەوە، ودۆزەخ هەر داوای دەکات دەڵێت: زیاتر نیە؟ تا ئەوەی پەروەردگار قاچی دەخاتە ناوی ودۆزەخ دێتەوە یەك ودەڵێت: بەسە بەسە سوێند بە گەورەیی وڕێزت. وە بەردەوام بەهەشت دەبێتە فەزڵ وڕێز تا ئەوەی پەروەردگار خەڵکانێك دروست دەکات وبەهەشتیان پێ پڕدەکات.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- بەهەشت فەزڵ ونیعمەتی پەروەردگارە بۆ دۆستەکانی ودۆزەخیش سزای پەروەردگارە بۆ سەرپێچیکارانی.

٢- لە تەوحید وبیروباوەڕی پاك ئەوەیە باوەڕمان وایە پەروەردگار خاوەنی سیفەتی قاچە، بە شێوەیەك کە شایستەی گەورەیی خۆیەتی وبەهیچ شێوەیەك لە سیفەتی مخلوق ناچێت.

**٣-** باوەڕمان وایە لە ڕۆژی دواییدا پەروەردگار کۆمەڵێك خەلکی زۆر دروست دەکات دەیانخاتە بەهەشت بە فەزڵ وڕێزی خۆی بە بێ ئەوەی دونیایان بینی بێت.



## فەرموودەی (٧)

أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِي صَلَاتِي. قَالَ: (قُلِ: اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا، وَلَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مِنْ عِنْدِكَ مَغْفِرَةً، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ). (رواه البخاري: ٧٣٨٨)

### واتای فەرموودەکە:

ئەبو بەکری صدیق رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نزایەکم فێر بکە کە لە نوێژەکانمدا نزای پێبکەم.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بڵێ ئەی پەروەردگارم من ستەمی زۆرم لە نەفسی خۆم کردووە -بە هۆکاری تاوان وکەمتەرخیمەوە- وە هیچ کەسێکیش بە ئەندازەی تۆ بەخشندە ولێبوردە نیە، دەسا لێمخۆشبە بە لێخۆشبوونێك لەلایەن خۆتەوە، بێگومان تۆ لێخۆشبوو وبەرەحمیت.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- پەروەردگار خاوەنی سیفەتی ڕەحمەت وسۆزی حەقیقیە سیفەتێك کە شایستەیە لەگەڵ گەورەیی وبەرزێتی خۆیدا.

٢- دوعا ونزاکردن لەناو نوێژدا بەم دوعایە وهەر دوعایەکی تر بێت سوننەتە.

٣- لە ئادابی داوای لێخۆشبوونکردن ودوعا ئیعترافکردنە بە تاوان وکەم وکوڕی خۆت بەرامبەر پەروەردگار.

## فەرموودەی (٨)

عن جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ السَّلَمِيُّ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعَلِّمُ أَصْحَابَهُ الِاسْتِخَارَةَ فِي الْأُمُورِ كُلِّهَا كَمَا يُعَلِّمُ السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ، يَقُولُ: (إِذَا هَمَّ أَحَدُكُمْ بِالْأَمْرِ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ الْفَرِيضَةِ، ثُمَّ لِيَقُلِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ، وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ، وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ ؛ فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلَا أَقْدِرُ، وَتَعْلَمُ وَلَا أَعْلَمُ، وَأَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ، اللَّهُمَّ فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ هَذَا الْأَمْرَ) - ثُمَّ تُسَمِّيهِ بِعَيْنِهِ – (خَيْرًا لِي فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ) قَالَ: (أَوْ فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي - فَاقْدُرْهُ لِي وَيَسِّرْهُ لِي، ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ، اللَّهُمَّ وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّهُ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي) أَوْ قَالَ: (فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ - فَاصْرِفْنِي عَنْهُ، وَاقْدُرْ لِيَ الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ، ثُمَّ رَضِّنِي بِهِ ). (رواه البخاري:٧٣٩٠)

### واتای فەرموودەکە:

جابری کوڕی عبدالله دەفەرمویێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵەکانی فێری ئیستیخارە دەکرد لە هەموو شتێکدا وەك چۆن سورەتەکانی قورئانی فێردەکردن، دەیفەرموو: هەر کەسێك لە ئێوە ویستی کارێك بکات با دوو ڕکات نوێژ بکات جگە لە نوێژە فەرزەکان، پاشان بڵێت: ئەی پەروەردگار بەزانستی خۆت داوای باشترین بژاردەت لێدەکەم، وە بەتوانایی خۆت داوای هێز وتوانایت لێدەکەم، وە داوای فەزڵ وبەخشینی خۆتت لێدەکەم، بێگومان تۆ بەتوانایت ومن بێتوانا، تۆ دەزانیت ومن نازانم، تۆ زۆر شارەزای پەنهانەکانی، ئەی پەروەردگار تۆ دەزانیت ئەگەر ئەم کارە (ناوی کارەکە بهێنێت) خێری دونیا قیامەتمی

تێدایە، یان خێری دین وژیان وسەرئەنجاممی تێدایە، ئەوا هێزم بدەرێ ویارمەتیم بدە وبۆم ئاسان بکە، وە ئەی پەروەردگار تۆ باش دەزانیت کە ئەگەر ئەم کارە (ناوی کارەکە بهێنێت) شەڕ وخراپەی تێدایە بۆ دین ودونیا وسەرئەنجامم، یان بۆ دونیا وقیامەتم ئەوا لێمدووربخەرەوە، وخێری تر بهێنەرە ڕێم ودڵیشم لەسەری ڕازی بکە.

## سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- پەروەردگار خاوەنی زانستی فراوانی پێشوەختەی تەواوی دروستکراوەکانێتی وزانستی بە هەموو شتیك هەیە.

٢- ئیستیخارە سوننەتێکی گەورە وگرنگی پێدراوی پێغەمبەری خوا ﷺ وەهاوەڵان بووە، بەشێوەیەك ئەوان تەنانەت بۆ کڕینی پێڵاوەکانیان ئیستیخارەیان دەکرد، بەڵام ئێمە بۆ گرنگترین کارەکانمان پشتگوێمان خستووە.

٣- پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو شتێکی فێری هاوەڵان کرد،هیچ شتێك نەبوو خێری دونیا وقیامەتی تیدا بێت یان شەڕی دونیا وقیامەتی تێدابێت بێگومان هاوەڵانی لێ ئاگادار کردۆتەوە ودینی بە کامڵێتی بەجێهێشت.

## فەرموودەی (٩)

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: (إِنَّ لِلَّهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْمًا، مِائَةً إِلَّا وَاحِدًا، مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ). أَحْصَيْنَاهُ: حَفِظْنَاهُ.( رواه البخاري: ٧٣٩٢)

### واتای فەرموودەکە:

ئەبی هورەیرە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی: بێگومان پەروەردگار نەوەد ونۆ ناوی هەیە، سەد ناو دانەیەك نەبێت، هەر کەسێك لەبەریان بکات دەچێتە بەهەشتەوە.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- پەروەردگار خاوەنی ناوی جوانی بێشومارە، ولە بیروباوەڕی پاك ئیمان هێنانە بەوەی کە پەروەردگار ناوی هەیە وناوەکانیشی سیفەتیان لە خۆگرتووە.

٢- لەو ناوە جوانانەی نەوەد ونۆ ناوە کە هاتووە لە قورئان وفەرموودەدا هەرکەس لەبەریان بکات وکردەوەیان پێبکات دەچێتە بەهەشتەوە.



## فەرموودەی (١٠)

عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ هُنَا أَقْوَامًا حَدِيثًا عَهْدُهُمْ بِشِرْكٍ، يَأْتُونَا بِلُحْمَانٍ، لَا نَدْرِي يَذْكُرُونَ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهَا أَمْ لَا؟ قَالَ: ( اذْكُرُوا أَنْتُمُ اسْمَ اللَّهِ وَكُلُوا ).( رواه البخاري: ٧٣٩٨)

### واتای فەرموودەکە:

عائیشە فەرمووی: دەڵێن ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەسانێك هەن تازە موسوڵمانبوون وگۆشتمان بۆ دەهێنن ونازانین کە ئایا ناوی خوایان لەسەر هێناوە یان نا؟ فەرمووی: ئێوە ناوی خوای لەسەر بهێنن وبیخۆن.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- پەروەردگار خاوەنی ناوی جوان وبەڕێزە وپێویستە یان سوننەتە کاتی حەیوان سەربڕین بە ناوی خوا سەربڕدرێن.

٢- خەڵکانێك کە ئیسلامیان دەرخستبێت و دوور کەوتبێتنەوە لە شیرك ولەوڵاتی ئیسلامدا بژین سەربڕاوی دەستیان دروستە جا بسم الله یان لەسەری کردبێت یان نا.

بە پێچەوانەوە حوکمەکەش پێچەوانە دەبێتەوە.



## فەرموودەی (١١)

عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ : (لَا تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، وَمَنْ كَانَ حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ).( رواه البخاري: ٧٤٠١)

### واتای فەرموودەکە:

ئیبن عومەر -ڕەزای خوا لە خۆی وباوکی بێت- فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوێند بە باوباپیرانتان مەخۆن، هەرکات سوێندتان خوارد تەنها سوێند بە الله بخۆن.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- لەتەواوێتی تەوحید وئیمان ئەوەیە جگە لە الله وسیفاتەکانی سوێند بە هیچ مەخلوقێك نەخورێت.

٢- سوێندخواردن بە غەیری الله کوفر وشیرکی بچوکە تاوانەکەی لە تاوانە گەورەکان گەورەترە، بەڵام موسوڵمانی پێ کافر نابێت تا کاتێك کە لە دید وباوەڕی کەسەکە سوێندپێخوراو بگاتە ئاستی خوا لە گەورەیی وپیرۆزی لای ئەوکات دەبێتە کوفری گەورە وپێی دەردەچێت لە ئیسلام.



## فەرموودەی (١٢)

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَـالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ : يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: (أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي، وَأَنَا مَعَهُ إِذَا ذَكَرَنِي، فَإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِـي، وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلَأٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلَأٍ خَيْرٍ مِنْهُمْ، وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ بِشِبْرٍ تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعًا، وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ ذِرَاعًا تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ بَاعًا، وَإِنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً).( رواه البخاري: ٧٤٠٥)

### واتای فەرموودەکە:

ئەبی هورەیرە رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: خوای پەروەردگار فەرموویەتی: من لەگەڵ گومانی بەندەکەمدام پێم، ولەگەڵیدام کاتێك یادی من دەکات، ئەگەر لە نەفسی خۆیدا یادم بکات منیش لەنەفسی خۆمدا یادی دەکەم، ئەگەر لەناو کۆمەڵیدا یادم بکات منیش لەناو کۆمەڵێك زۆر لەوان باشتر یادی دەکەم، ئەگەر بستێك نزیك بێتەوە لێم وتەوبە بکات من باڵێك لێی نزیك دەبمەوە، ئەگەر بە ڕۆیشتن بێت بەرەو لام وتەوبە بکات من بەراکردن دێم بەرەو ڕووی.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- الله تعالی خاوەنی سیفەتی نەفسە ونەفسێك کە شایستەیە بە گەورەیی وبەرزێتی خۆیەوە.

٢- باشترین دروستکراوەکان لە ئاسمانەکانە بەتایبەت ئەوانەی الله لەگەڵیاندا قسە دەکات.

**٣-** گومانی باش بردن بە الله بەوەی لێبوردەیە لە تاوانەکان ولێخۆشبوو وبەڕەحمە بە تایبەت لە کاتی سەرەمەرگدا سوننەت وپێویستیەکی گرنگە، چونکە پەروەردگار لەگەڵ گومانی باشی بەندەکانیدایە.

**٤-** پەروەردگار تەوبەی بەندەکانی زۆر پێ خۆشە، ولە هەموو تاوانێك خۆش دەبێت ئەگەر بەندە بە جوانی بگەڕێتەوە وتەوبە بکات.



## فەرموودەی (١٣)

عن أَنَس رضي الله عنه ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَـالَ: (مَا بَعَثَ اللَّهُ مِنْ نَبِيٍّ إِلَّا أَنْذَرَ قَوْمَهُ الْأَعْوَرَ الْكَذَّابَ، إِنَّهُ أَعْوَرُ، وَإِنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَعْوَرَ، مَكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ كَافِرٌ).( رواه البخاري: ٧٤٠٨)

### واتای فەرموودەکە:

ئەنەس رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: هیچ پێغەمبەرێك نیە کە الله ڕەوانەی کردبێت گەلەکەی ئاگادارنەکردبێتەوە لە کوێرە درۆزنەکە، دەجال کوێرە وبێگومان پەروەردگارتان کوێر نیە، دەجال لە نێوچاویدا نوسراوە کافر.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- الله تعالی خاوەنی دووچاوی حەقیقی پیرۆزی خۆیەتی وبەهیچ شێوەیەك لە چاوی دروستکراوەکانی ناچێت.

٢- گەورەترین تاقیکردنەوە وفیتنە بۆ سەر مرۆڤەکان کە بەهۆیەوە زۆرینەی خەلکی سەرزەوی ئیمان دەدۆڕێنن وکافر دەبن دەجالە کە دێت بانگەشەی خوایەتی دەکات.

٣- مەعبودی حەق خاڵی ودوورە لە هەموو عەیب وعارێك وتەواوی معبودە بەتاڵەکان پڕ عەیبن.



## فەرموودەی (١٤)

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: (يَدُ اللَّهِ مَلْأَى، لَا يَغِيضُهَا نَفَقَةٌ، سَحَّاءُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ.) وَقَالَ: (أَرَأَيْتُمْ مَا أَنْفَقَ مُنْذُ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ، فَإِنَّهُ لَمْ يَغِضْ مَا فِي يَـدِهِ.) وَقَالَ: (عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ، وَبِيَدِهِ الْأُخْرَى الْمِيزَانُ، يَخْفِضُ وَيَرْفَعُ). (رواه البخاري: ٧٤١١)

### واتای فەرموودەکە:

لە ئەبی هورەیرە ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: دەستی الله دائم پڕە، وهیچ بەخشینێك لێی کەمناکاتەوە، بەخشەرە بە شەو ورۆژ.

وە فەرمووی: مەگەر تێنافکرن چی بەخششیووە لەو ساتەوەی ئاسمانەکان وزەوی دروست کردووە، بێگومان هیچ لەوەی لە دەستیدایە کەم نەبۆتەوە.

وە فەرمووی: عەرشەکەی لەسەر ئاوە وبەدەستەکەی تری میزانی پێیە نزم وبەرزی دەکاتەوە -کێی بوێت چی بوێت-.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- الله خاوەنی دوو دەستی حەقیقی خۆیەتی ودەستەکانی لە دەستی هیچ مەخلوقێکی ناچێت، دەستێك شایستەیە لەگەڵ گەورەیی وشکۆی خۆیدا.

٢- ئیمان هێنان بە سیفەتی دەستی حەقیقی الله لە تەوحید بیروباوەڕی پاکی ئەهلی سوننەیە بە پێچەوانەی گروپە لارێکانەوە وەك جەهمیەکان وئەشعەریەکان وماتوریدیەکان وگروپە فەلسەفیەکان کە ئایەت وفەرموودەکانی سیفەتی دەستی پەروەردگار تەحریف دەکەن بە دەستی قودرەت وتوانایی.

٣- پەروەردگار خاوەنی عەرشێکی گەورەی خۆیەتی لەسەرو ئاسمانەکان وعەرشەکەی لەسەر ئاوە.



# فەرموودەی (١٥)

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (إِنَّ اللَّهَ لَمَّا قَضَى الْخَلْقَ كَتَبَ عِنْدَهُ فَوْقَ عَرْشِهِ: إِنَّ رَحْمَتِي سَبَقَتْ غَضَبِي). (رواه البخاري: ٧٤٢٢)

## واتای فەرموودەکە:

لە ئەبی هوڕەیرە ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: کاتێك خوای پەروەردگار لە نووسینی قەدەر ودروستکردنی دروستکراوەکان لێبوویەوە لای خۆی لەسەرو عەرش نووسی: بێگومان ڕەحمەت وسۆزم لە پێش تووڕەبوونمەوەیە.

## سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- لە تەوحید وئیمان ئەوەیە کە باوەڕت وا بێت پەروەردگار لەسەر عەرشە لە سەروو ئاسمانەکان.

٢- پەروەردگار سیفەتی نووسینی هەیە نووسینێك شایستە بە گەورەیی وشکۆی خۆی.

٣- ڕەحمەت وسۆزی پەروەردگار لە پێش توڕەبوو نیەوەیەتی، و ڕەحمەت ولیخۆشبوونی زۆر فراوانە.



## فەرموودەی (١٦)

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ عِنْدَ الْكَرْبِ: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ الْعَلِيمُ الْحَلِيمُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَرَبُّ الْأَرْضِ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ).( رواه البخاري: ٧٤٢٦ )

### واتای فەرموودەکە:

لە ئیبن عەبباسەوە - الله لە خۆی وباوکی ڕازی بێت- هاتووە کە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی نارەحەتیدا دەیفەرموو: هیچ پەرستراوێك نیە شایستەی پەرستن بێت جگە لە الله کە خاوەنی عیلم وحیلمە، هیچ پەرستراوێك نیە شایستەی پەرستن بێت جگە لە الله کە خاوەنی عەرشی گەورەیە، هیچ پەرستراوێك نیە شایستەی پەرستن بێت جگە لە الله کە پەروەردگاری ئاسمانەکان وە زەوی وعەرشی گەورەیە.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- دوو ناوی پەروەردگار بریتیە لە (العلیم) و(الحلیم) کە دوو سیفەتی بەرز لە خۆدەگرن کە سیفەتی زانستی تەواو وهێمنی وئارامیە.

٢- پەروەردگار خاوەنی عەرشێکی گەورەیە، خودی خۆشی لەسەر عەرشە بەشێوەیەك کە شایستەی گەورەیی وپیرۆزی خۆیەتی.

٣- سوننەتە لەکاتی نارەحەتیدا ئەو زیکر ودوعایە بخوێنرێت.



## فەرموودەی (١٧)

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: (يَتَعَاقَبُونَ فِيكُمْ مَلَائِكَةٌ بِاللَّيْلِ وَمَلَائِكَةٌ بِالنَّهَارِ، وَيَجْتَمِعُونَ فِي صَلَاةِ الْعَصْرِ وَصَلَاةِ الْفَجْرِ، ثُمَّ يَعْرُجُ الَّذِينَ بَاتُوا فِيكُمْ، فَيَسْأَلُهُمْ - وَهُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ -) فَيَقُولُ: (كَيْفَ تَرَكْتُمْ عِبَادِي ؟) فَيَقُولُونَ: (تَرَكْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ، وَأَتَيْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ). (رواه البخاري: ٧٤٢٩)

### واتای فەرموودەکە:

ئەبی هورەیرە رضي الله عنه دەفەرمویت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: فریشتەکان جێگۆڕکێ دەکەن لاتان بە شەو ورۆژ، لەکاتی نـوێژی عەسر وبەیانی دەگەن بەیەکتر، کاتێك ئەوانەی شەو لاتان بوون سەردەکەونەوە بۆ ئاسمان پەروەدگار -هەرچەندە زاناترە پێتان- پێیان دەفەرموێت: چۆن بەندەکانمتان جێهێشت؟ ئەوانیش دەڵێن: بەجێمان هێشتن ئەوان نوێژیان دەکرد، چووین بۆ لایان نوێژیان دەکرد.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- پەروەردگار سیفەیی بەرزێتی هەیە وبەزاتی خۆی لەسەر عەرشە، ومەلائیکەتەکان لای ئەوەوە دادەبەزن وبەرز دەبنەوە بۆ لای ئەو.

٢- گرنگێتی نویـژی بەیانی وعەسر لەکاتی خۆیدا بە جەماعەت هۆکارە بۆ ئەوەی مەلائیکەت باست بکەن لای پەروەردگار وشاهێدیت بۆ بدەن.



## فەرموودەی (١٨)

عَنْ جَرِيرٍ قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ ؛ إِذْ نَظَرَ إِلَى الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ، قَالَ: (إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا الْقَمَرَ، لَا تُضَامُونَ فِي رُؤْيَتِهِ، فَإِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ لَا تُغْلَبُوا عَلَى صَلَاةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَصَلَاةٍ قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ فَافْعَلُوا). ( رواه البخاري: ٧٤٣٤)

### واتای فەرموودەکە:

جابر رضي الله عنه دەفەرموێت: لای پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین وسەیری مانگی دەکرد لە شەوی چواردەدا، وفەرمووی: بێگومان ئێوە پەروەردگارتان دەبینن وەك چۆن ئەو مانگە دەبینن، هیچ نارەحەتیەکتان بۆ پێشنایەت لە بینینیدا، ئەگەر توانیتان نەهێڵن هیچ ڕێگرێك زاڵ بێت بەسەرتاندا کە نوێژی بەیانی وعەسر لەکاتی وخۆیدا وبەجەماعەت بکەن ئەوا بەو شێوەیە بکەن.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- لە تەوحید وئیمانی پاك ئەوەیە کە باوەڕمان وابێت پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا بە چاوەکانی سەر دەبینرێت، بەپێچەوانەی گروپە گومڕاکانەوە کە ئیمانیان بە بینینی الله نیە بەچاوی سەر.

٢- شوبهاندنی دیمەنی مانگ بە بینینی الله، شوبهاندنی بینینە بە بینین نەك بینراو بە بەبینراو چونکە الله لەهیچ شتێك ناچێت.

**٣-** پارێزگاری لە نوێژەکان بەتایبەت نوێژی بەیانی وعەسر بە جەماعەت ولەکاتی خۆیدا هۆکارێکی گرنگی گەیشتنە بە دیداری پەروەردگار.



## فەرموودەی (١٩)

عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ عَنْ أَبِيهِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (جَنَّتَانِ مِنْ فِضَّةٍ آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا، وَجَنَّتَانِ مِنْ ذَهَبٍ آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا، وَمَا بَيْنَ الْقَوْمِ وَبَيْنَ أَنْ يَنْظُرُوا إِلَى رَبِّهِمْ إِلَّا رِدَاءُ الْكِبْرِ عَلَى وَجْهِهِ فِي جَنَّةِ عَدْنٍ).

رواه البخاري: ٧٤٤٤)

### واتای فەرموودەکە:

لە ئەبی بەکری کوڕی عەبدوڵای کوڕی قەیس ئەویش لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: دوو باخ وبێستانی گەورە لە زیو کە هەموو قاپ وقاچاخ وئەوەی تێیدایە زیوە، وە دوو باخ وبێستانی گەورە لە ئاڵتوون کە قاپ وقاچاخ وئەوەی تێیدایە لە ئاڵتوونە، وە لە نێوان خەڵکانێك وئەوەی پەروەردگاریان ببینن پەردە وپۆشاکی کیبرە کە بەسەر ڕووخساری پەروەردگارەوە لە بەهەشتەکانی عەدن.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- لە تەوحیدی پەروەردگار ئیمانە بەوەی الله لە ڕۆژی دواییدا دەبینرێت وئەو پەردەیە لا دەچێت کە لە نێوان بینینی خوا وبەندەکانیدا هەیە.

٢- الله خاوەنی سیفەتی ڕووخسارە بە شێوەیەك کە شایستەی گەورەیی وشکۆی خۆیەتی.

٣- بەهەشت ئامادەکراوە وبوونی هەیە ئێستا بە پێچەوانەی جەهمی وموعتەزیلەکانەوە کە پێیان وایە دوای کۆتایی دونیا دروست دەکرێت.



# فەرموودەی (٢٠)

عَنْ أَنَسٍ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (لَيُصِيبَنَّ أَقْوَامًا سَفْعٌ مِنَ النَّارِ بِذُنُوبٍ أَصَابُوهَا؛ عُقُوبَةً، ثُمَّ يُدْخِلُهُمُ اللَّهُ الْجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ، يُقَالُ (لَهُمْ: الْجَهَنَّمِيُّونَ).( رواه البخاري: ٧٤٥٠)

## واتای فەرموودەکە:

ئەنەس دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: خەڵکانێك نیشایەکیان لەسەر دروست دەبێت لەدۆزەخدا بەهۆی تاوانەکانیانەوە وەك سزایەك بۆیان، پاشان خوای گەورە بەفەزڵ ولێخۆشبوونی خۆی دەیانخاتە بەهەشتەوە پێیان دەوترێت: جەهەنمیەکان.

## سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- لە بیروباوەڕی ئەهلی سوننە ئەوەیە کە خاوەن تاوانە گەورەکان بەهەتایی لە دۆزەخدا نامێننەوە پێچەوانەی فکری خەوارج ومعتزلەکان کە پێیان وایە هەرکەس خرایە دۆزەخ ئیتر بە هەتایی دەمێنێتەوە ئەگەر خاوەنی کوفر وشیرکیش نەبێت.

٢- پەروەردگار خاوەنی ڕەحم ولێخۆشبوونێکی فراوانە وسیفەتی حەقیقی ڕەحمەتی هەیە پێچەوانەی ئەشعەریەکان وماتوریدیەکان کە پێیان وایە الله سیفەتی ڕەحمەتی نیە بەلکو ویستی پاداشتدانەوەی هەیە.



## فەرموودەی (٢١)

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ  قَالَ: جَاءَ حَبْرٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، إِنَّ اللَّهَ يَضَعُ السَّمَاءَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالْأَرْضَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالْجِبَالَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالشَّجَرَ وَالْأَنْهَارَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَسَائِرَ الْخَلْقِ عَلَى إِصْبَعٍ، ثُمَّ يَقُولُ بِيَدِهِ : أَنَا الْمَلِكُ.
فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ، وَقَالَ: ({وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ}). ( رواه البخاري: ٧٤٥١)

### واتای فەرموودەکە:

له عبدولڵای کوڕی مەسعودەوە هاتووە کە دەفەرمویت: زانایاکی یەهودی هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ووتی: ئەی محمد بیگومان الله ئاسمانەکان دەخاتە سەر پەنجەیەکی، وە زەوی دەخاتە سەر پەنجەیەکی، وە شاخەکان لەسەر پەنجەیەکی، وە دار ودرەخت ورووبارەکان لەسەر پەنجەیەکی، وە تەواوی دروستکراوەکانی تری لەسەر پەنجەیەکی، پاشان دەفەرمویت: من پادشا ودەسەلاتدارم.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی وئەو ئایەتەی خوێندەوە: {وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ}.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- له تەوحید وئیمانی پاکە ئیمانمان وا بێت پەروەردگار خاوەنی سیفەتی پەنجەیە، بەشێوەیەك کە شایستەی گەورەیی وشکۆی خۆیەتی وبەهیچ شێوەیەك لە دروستکراوەکانی ناچێت.

٢- پێکەنینی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ قسەی زانا یەهودیەکە ئیقرار وبەراستخستنەوەی بوو، وە بەڵگە یە لەسەر ئەوەی یەهودیەکان زانستیان بە سیفەتەکانی پەروەردگار هەیە پێچەوانەی جەهمی وئەشعەریەکان کە بەئەندازەی یەهودیەکانیش الله ناناسن!.



## فەرموودەی (٢٢)

عن عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ رضي الله عنه، حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ، (أَنَّ خَلْقَ أَحَدِكُمْ يُجْمَعُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا وَأَرْبَعِينَ لَيْلَةً، ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَهُ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَهُ، ثُمَّ يُبْعَثُ إِلَيْهِ الْمَلَكُ، فَيُؤْذَنُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ؛ فَيَكْتُبُ رِزْقَهُ وَأَجَلَهُ وَعَمَلَهُ، وَشَقِيٌّ أَمْ سَعِيدٌ، ثُمَّ يَنْفُخُ فِيهِ الرُّوحَ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ حَتَّى لَا يَكُونُ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُ إِلَّا ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، فَيَدْخُلُ النَّارَ، وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُ إِلَّا ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ، فَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَيَدْخُلُهَا).( رواه البخاري: ٧٤٥٤)

### واتای فەرموودەکە:

لە ئیبن مەسعودەوە هاتووە کە فەرموویەتی: وەرمگرتووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە ڕاستگۆی بەڕاستدانراوە فەرموویەتی: هەریەکێك لە ئێوە لە ماوەی چل شەو ورۆژدا لە سکی دایکیدا کۆدەکرێتەوە پاشان دەبێتە پارچە خوێنێکی هەڵواسراو چل شەو ورۆژی تر، پاشان دەبێتە پارچە گۆشتێکی جیوراو چل شەو ورۆژی تر، پاشان فریشتەیەك دەنێردرێت فەرمانی پێ دەکرێت بە چوار شت: ڕزق وکاتی مردنەکەی وکردەوەکانی وئەوەی کە کەسێکی بەختەوەر یان لاڕێ دەبێت دەنووسێت، پاشان ڕۆح دەکرێت بە بەریدا، بۆیە بێگومان هەتانە کردەوەی ئەهلی بەهەشت دەکات تاوەکو نێوانی ئەو وبەهەشت باڵێکی دەمێنێت، قەدەرەکەی پێشیدەکەوێت وکردەوەی دۆزەخیەکان

ئەنجام دەدات ودەچێتە دۆزەخەوە، وە هەشتانە كردەوەی دۆزەخیەكان ئەنجام دەدات تاوەكو نێوانی ئەو ودۆزەخ باڵێكی دەمێنێت قەدەرەكەی پێشیدەكەوێت وكردەوەی بەهەشتیەكان ئەنجام دەدات ودەچێتە بەهەشتەوە.

## سوودە هەڵبژێردراوەكان لە فەرموودەكە:

١- قەدەر سرٍ ونهێنی پەروەردگارە وپیش ئەوەی لەدایك ببین دەزانێت ئێمە رٍزق وتەمەنمان چەندە وكاروكردەوەمان چۆن دەبێت، وئەم زانستەشی لای خۆی تۆمار كردووە.

٢- زانست ونوسینی چارەنووسمان لە قەدەردا واتای بەزۆرپێكردن وبیٚ ئیرادەیی مرۆڤەكان نایەت، بەلكو بوونی عەقلٚ وناردنی پێغەمبەران وكتێبە ئاسمانیەكان بەلگەی ئەوەن كە مرۆڤەكان ویست وئیرادەیان هەیە لەسەر كاروكردوەكانیان.

٣- عیبرەت بە كۆتایی حاڵە كە مرۆڤ لەسەرچی وبەچیەوە دەمرێت، تا ئەوەی كەس مەغرور ولەخۆبایی نەبێت بە كاروكردەوەی چاكی وئەو حاڵەی تێیدایە.

## فەرموودەی (٢٣)

عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: (الرَّجُل يُقَاتِلُ حَمِيَّةً، وَيُقَاتِلُ شَجَاعَةً، وَيُقَاتِلُ رِيَاءً، فَأَيُّ ذَلِكَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ؟.) قَالَ: (مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا، فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ).( رواه البخاري: ٧٤٥٨)

### واتای فەرموودەکە:

ئەبی موسی ئەشعەری دەفەرمویێت: پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: کەسێك لە پێناو دەمارگیری دەجەنگێت، وکەسێك لە پێناو ئازایەتی دەجەنگێك، وکەسێك بۆ ڕوپامایی دەجەنگێت، کامیان لە پێناو خوایە وپێی دەوترێت تێکۆشان وجەنگان لەپێناو الله؟

فەرمووی: ئەوەی بجەنگێت لەپێناو ئەوەی ووتەی الله بەرقەرار وبەرز وسەروەر بێت تەنها ئەوە لە پێناو الله وجیهادە.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- پەروەردگار خاوەنی سیفەتی قسەکردن ووتەی هەیە، قورئانیش ووتەی خوایە ودروستکراونیە، ئەگەر قورئان وقسەی خوا مخلوق بوایە وەك جەهمیەکان دەیلێن، کەواتە جیهاد لە پێناو سەروەری ووتەی خوا شیرك بوو چونکە تێکۆشان بوو لە پێناو مخلوق وجیهادیش عیبادەتە ودەبێت بس بۆ الله ئەنجامبدرێت.

٢- جەنگان لە پێناو دەرمارگیری وعەشیرەتگەرایی وحیزبگەرایی وگەل ونەتەوەگەرایی وسەروەری یاسا دەستکردەکان جەنگانە لە پێناو

ڕازیکردنی شەیتان، تەنها جەنگان لەپێناو سەروەری شەریعەت وبەرزێتی ووتەی خوا جەنگانە لە پێناو اللە.

٣- ووتەی خوا وشەریعەتەکەی هەموو کات بەرزە سەروەرە کەسانێکی دڵسۆز ویەکخواپەرستی دەوێت کە شانبخەنە ژێری وببنە هەڵگری وهۆکاری بڵاوبوونەوە وبەرقەراربوونی.



## فەرموودەی (٢٤)

مُعَاوِيَةَ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: (لَا يَزَالُ مِنْ أُمَّتِي أُمَّةٌ قَائِمَةٌ بِأَمْرِ اللَّهِ، مَا يَضُرُّهُمْ مَنْ كَذَّبَهُمْ، وَلَا مَنْ خَالَفَهُمْ، حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ وَهُمْ عَلَى ذَلِكَ). فَقَالَ مَالِكُ بْنُ يُخَامِرَ: سَمِعْتُ مُعَاذًا يَقُولُ : وَهُمْ بِالشَّأْمِ. ( رواه البخاري: ٧٤٦٠)

### واتای فەرموودەکە:

موعاویە دەفەرموێت بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەیفەرموو: بەردەوام گروپێك لە ئوممەتەکەم دامەزراو دەبن لەسەر حەق بە ویست وفەرمانی خوا، ئەوانەی بەدرۆیان دادەنێن وپێچەوانەیانن ناتوانن زەرەریان پێ بگەینن وهەتا فەرمانی بەرپابوونی قیامەت ئەوان هەر دەمێنن ولەسەر حەقن.

مالکی کوڕی یوخامر فەرمووی: بیستم لە موعاذ کە دەیفەرموو: پیش هاتنی قیامەت ئەوانە لە شامن.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- پەروەردگار سیفەتی قسەکردنی هەیە وفەرمان دەردەکات، بە پێچەوانەی جەهمیە کافرەکانەوە کە پێیان وایە الله قسەناکات.

٢- هیچ سەردەمێك نیە کە بێت ئوممەتدا ئیلا گروپ وکەسانێك هەن کە لەسەر حەقن وبانگەوازی پێغەمبەران بەرپادەکەن.

٣- لە کۆتایی دونیادا ئەهلی تەوحید وسوننەت لە شام کۆدەبنەوە.



## فەرموودەی (٢٥)

عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي رَهْطٍ، فَقَالَ: (أُبَايِعُكُمْ عَلَى أَنْ لَا تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا، وَلَا تَسْرِقُوا، وَلَا تَزْنُوا، وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُمْ، وَلَا تَأْتُوا بِبُهْتَانٍ تَفْتَرُونَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَأَرْجُلِكُمْ، وَلَا تَعْصُونِي فِي مَعْرُوفٍ، فَمَنْ وَفَى مِنْكُمْ، فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا، فَأُخِذَ بِهِ فِي الدُّنْيَا، فَهُوَ لَهُ كَفَّارَةٌ وَطَهُورٌ، وَمَنْ سَتَرَهُ اللَّهُ، فَذَلِكَ إِلَى اللَّهِ، إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ، وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ).(رواه البخاري: ٧٤٦٨)

### واتای فەرموودەکە:

عوبادەی کوڕی صامت دەفەرمویێت: لەگەڵ کۆمەڵێك گەنجی تردا بەیعەتماندا بە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەیعەتتان لێوەردەگرم لەسەر ئەوەی کە هاوەڵ بۆ الله بڕیار نەدەن بەهیچ شێوەیەك، دزی نەکەن، زینا نەکەن، منداڵەکانتان لەبار نەبەن ونەیانکوژن، وبوهتان وقسەهێنان وبردن مەکەن لە نێوانتاندا، ولە چاکەدا بێفەرمانیم مەکەن، هەرکەسێکتان وەفا بەو بەیعەتەوە بکات ئەوا پاداشتەکەی هەر لای پەروەردگارە، وهەر کەسێکیشتان گیرۆدەی یەکێك لەو تاوانانە بوو ئەگەر سزاکەی وەرگرت لە دونیادا ئەوا کەفارەت وپاك بوونەوەیەتی، ئەوەشی خوا سەتری کرد وئاشکرای نەکرد ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا ئەگەر ویستی لێبوو سزای دەدات، ئەگەر ویستیشی لێبوو لێی خۆشدەبێت.

## سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- هەموو شتێك لە ژێر ویست وئیرادەی پەروەردگاردایە ئەوەی ئەو ویستی لێبێت هەر ئەوە دەبێت.

٢- جێبەجێکردنی سزا شەرعیەکان بۆ تاوانباران بۆ کەفارەت وپاکبوونەوەیە.

٣- ئەوەی بە شیرکەوە بڕواتەوە بۆ لای خوا جیگای دۆزەخە بەهەتایی ولێخۆشبوونی خوا ئەهلی شیرك وکوفر ناگرێتەوە، ئەم فەرموودەیە بە نیسبەت لێخۆشبوونی خوا بۆ ئەهلی شیرك موتەشابیهە پێویسیە بگەڕێینەوە بۆ ئایەت وفەرموودە موحکەمەکان وەك: {إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاءُ وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا}



## فەرموودەی (٢٦)

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى إِذَا أَحَبَّ عَبْدًا نَادَى جِبْرِيلَ: إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَبَّ فُلَانًا فَأَحِبَّهُ. فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ، ثُمَّ يُنَادِي جِبْرِيلُ فِي السَّمَاءِ: إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَبَّ فُلَانًا فَأَحِبُّوهُ. فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ، وَيُوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِي أَهْلِ الْأَرْضِ).( رواه البخاري: ٧٤٨٥)

### واتای فەرموودەکە:

ئەبی هورەیرە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کاتێك پەروەردگار بەندەیەکی خۆشدەوێت بانگی جبریل دەکات پێی دەفەرموێت: بێگومان پەروەردگارت فلآن کەسی خۆشدەوێت تۆش خۆشتبوێت، وجبریلیش خۆشیدەوێت، پاشان جبریل بە ئاسماندا بانگ دەکات: پەروەردگار فلآن کەسی خۆشدەوێت ئێوەش خۆشتانبوێت، ئیتر خەڵکی ئاسمانیش خۆشیاندەوێت، ولەسەر زەویش ئەو کەسە خۆشەویست دەبێت -لای ئەهلی ئیمان-.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- پەروەردگار سیفەتی قسەکردن وبانگردنی هەیە بە حەرف ودەنگ کە مەلائیکەت وپێغەمبەران گوێیان لێی بووە.

٢- پەروەردگار سیفەتی خوشویستنی هەیە وبەندە باشەکانی خۆی خۆشدەوێت.

٣- ئەوەی ئیمانی بە قسەکردنی پەروەردگار نەبێت ئەهلی تەوحید وئیمان نیە.



## فەرموودەی (٢٧)

عن أَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَـالَ: (أَتَانِي جِبْرِيلُ، فَبَشَّـرَنِي أَنَّهُ مَنْ مَاتَ لَا يُشْـرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ). قُلْتُ : وَإِنْ سَرَقَ وَإِنْ زَنَى؟ قَالَ: (وَإِنْ سَرَقَ وَإِنْ زَنَى).( رواه البخاري: ٧٤٨٧)

### واتای فەرموودەکە:

ئەبی زەڕ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێیەوە کە فەرموویەتی: جبریل هات بۆ لام مژدەی پێدام بەوەی کە هەر کەسێك بمرێت وشەریکی بۆ خوا بڕیار نەدابێت دەچێتە بەهەشتەوە.

وتم پێی: ئەگەر دزیشی کردبێت وزیناشی کردبێت؟

فەرمووی: بەڵێ ئەگەر دزیشی کردبێت وزیناشی کردبێت.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- پەروەردگار قسە لەگەڵ جبریل دەکات بەدەنگ وپەیامی خۆی پێدا دەنێرێت.

٢- فەزڵ وگەورەیی تەوحیدێکی پاك وخاڵیبوو لە کوفر وشیرك ئەوەیە کە لێخۆشبوونی خوا دەیگرێتەوە ئەگەر خاوەنەکەی تاوانی گەورەشی ئەنجامدابێت.

٣- هەرکەسێك بە شیرکەوە مرد شوێنی دۆزەخە بە هەتایی.



## فەرموودەی (٢٨)

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: (يَتَنَزَّلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الْآخِرُ)، فَيَقُولُ: (مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ؟ مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ؟ مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ؟). ( رواه البخاري: ٧٤٩٤)

### واتای فەرموودەکە:

ئەبی هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێیەوە کە فەرموویەتی: پەروەردگارمان هەموو شەوێك دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا ئەوسایەی سێیەکی شەوی ماوە، دەفەرموێت: کێ هەیە دوعا بکات ولێی گیرا بکەم؟ کێ هەیە داواکاریەکی هەیە وبۆی جێبەجێ بکەم؟ کێ هەیە داوای لێخۆشبوون بکات ولێیخۆشبم؟

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- لە تەوحید وبیروباوەڕی پاك ئەوەیە کە موسوڵمان ئیمانی بە سیفەتی دابەزینی پەروەردگاری هەبێت شەوانە بۆ ئاسمانی دونیا.

٢- ئەم دابەزینەش خودی پەروەردگار خۆیەتی دابەزینێك تەنها خۆی شێوازەکەی دەزانێت، بە پێچەوانەی گروپە گومڕاکانەوە کە تەحریفی واتای فەرموودەکە دەکەن ودەڵێن ئەو دابەزینە دابەزینی ڕەحمەت یان زانست یان ئەمر یان مەلائیکەتەکانێتی!

**٣-** پەروەردگاری ئێمە سیفەتی قسەکردنی هەیە وهەموو شەوێك قسە دەکات لە ئاسمانی دونیا ودەفەرموێت: کێ هەیە دوعا بکات ولێی گیرا بکەم؟ کێ هەیە داواکاریەکی هەیە وبۆی جێبەجێ بکەم؟ کێ هەیە داوای لێخۆشبوون بکات ولێیخۆشبم؟



## فەرموودەی (٢٩)

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَـالَ: (يَقُولُ اللَّهُ: إِذَا أَرَادَ عَبْدِي أَنْ يَعْمَلَ سَيِّئَةً، فَلَا تَكْتُبُوهَا عَلَيْهِ حَتَّى يَعْمَلَهَا، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا بِمِثْلِهَا، وَإِنْ تَرَكَهَا مِنْ أَجْلِي فَاكْتُبُوهَا لَهُ حَسَنَةً، وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَعْمَلَ حَسَنَةً فَلَمْ يَعْمَلْهَا، فَاكْتُبُوهَا لَهُ حَسَنَةً، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا لَهُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِمِائَةِ).( رواه البخاري: ٧٥٠١)

### واتای فەرموودەکە:

ئەبی هورەیرە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێیەوە کە فەرموویەتی: پەروەردگار -بە مەلائیکەتە نووسەرەکان- دەفەرمویێت: هەرکاتێك بەندەکەم وویستی تاوانێك بکات مەینوسن هەتا کاتێك ئەنجامی دەدات، کە ئەنجامیدا بە ئەندازەی خۆی تاوانەکە بنوسن، ئەگەر لە پێناو من وازی لێهێنا چاکەیەکی بۆ بنوسن، هەرکاتێك بەندەکەم وویستی چاکەیەك بکات ونەیتوانی بیکات چاکەیەکی هەر بۆ بنووسن، ئەگەر ئەنجامیشیدا ئەوا دەئەوەندە تا حەوتسەد ئەوەندە چاکەی بۆ بنووسن.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- پەروەردگار قسە لەگەڵ مەلائیکەتە نووسەرەکان دەکات بە حەرف و دەنگ و ئەوانیش گوێبیستی پەروەردگاریان دەبن، هەرکەس ئیمانی وانەبێت کە الله قسەدەکات بەحەرف ودەنگ موسوڵمان نیە.

٢- گەورەیی ڕەحم وسۆزی پەروەردگار بۆ بەندەکانی کە تەنها لەسەر ویستی کردەوەی چاك ئەگەر ئەنجامیش نەدرێت وەوازهێنان لە ئەنجامدانی کردەوەی خراپ لەبەر خوا ئەگەر ویستی تاوانیش هەبووبێت چاکەت بۆ دەنووسێت وپاداشتت هەیە، کە هەردوو حاڵەتەکە تەنها ویستی دڵە بەبێ ئەنجامدانی کردەوە.



## فەرموودەی (٣٠)

عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (مَا مِنْكُمْ أَحَدٌ إِلَّا سَيُكَلِّمُهُ رَبُّهُ، لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ تُرْجُمَانٌ، فَيَنْظُرُ أَيْمَنَ مِنْهُ، فَلَا يَرَى إِلَّا مَا قَدَّمَ مِنْ عَمَلِهِ، وَيَنْظُرُ أَشْأَمَ مِنْهُ فَلَا يَرَى إِلَّا مَا قَدَّمَ، وَيَنْظُرُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَلَا يَرَى إِلَّا النَّارَ تِلْقَاءَ وَجْهِهِ، فَاتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ).( رواه البخاري: ٧٥١٢)

### واتای فەرموودەکە:

عەدی کوڕی حاتەم دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێك نیە لە ئێوە کە پەروەردگار قسەی لەگەڵ نەکات لە ڕۆژی قیامەتدا بەبێ وەرگێڕ، بەندە سەیری لای ڕاست دەکات هیچ نابینێت جگە لەو کاروکردەوانەی پێشی خستووە، سەیری لای چەپیشی دەکات بەهەمان شێوە، لە پیش چاویشیەوە هیچ نابینێت جگە لە دۆزەخ کە ڕووبەڕوویەتی، بۆیە ئەگەر بە بەخشینی لەتەخورمایەکیش بووبێت خۆتان بپارێزن لە ئاگری دۆزەخ.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- لە بیروباوەڕی پاکی موسوڵمان ئەوەیە کە باوەڕی وایە پەروەردگار لەگەڵ یەك بەیەکی ئیمانداراندا قسەدەکات لە ڕۆژی قیامەتدا، قسەکردنێکی حەقیقی بێ ئەوەی هیچ وەرگێڕێك هەبێت.

٢- ئەم فەرموودەیە پوچەڵکردنەوەی بیروباوەڕی ئەشعەریەکان وتەواوی ئەو گروپە گومڕایانەیە کە پێیان وا نیە پەروەردگار بە دەنگ ڕاستەوخۆ لەگەڵ بەندەکاندا قسە دەکات.

## فەرموودەی (٣١)

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: (إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ لِأَهْلِ الْجَنَّةِ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ.) فَيَقُولُونَ: (لَبَّيْكَ رَبَّنَا وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ. فَيَقُولُ: هَلْ رَضِيتُمْ؟) فَيَقُولُونَ: (وَمَا لَنَا لَا نَرْضَى يَا رَبِّ وَقَدْ أَعْطَيْتَنَا مَا لَمْ تُعْطِ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ.) فَيَقُولُ: (أَلَا أُعْطِيكُمْ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ؟) فَيَقُولُونَ: (يَا رَبِّ، وَأَيُّ شَيْءٍ أَفْضَلُ مِنْ ذَلِكَ؟) فَيَقُولُ: (أُحِلُّ عَلَيْكُمْ رِضْوَانِي فَلَا أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ بَعْدَهُ أَبَدًا).(رواه البخاري: ٧٥١٨)

### واتای فەرموودەکە:

ئەبی سەعیدی خودری دەفەرمویت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پەروەردگار بانگی بەهەشتیەکان دەکات ودەفەرمویت: ئەی بەهەشتیەکان.

ئەوانیش دەڵێن: لەخزمەتتداین ئەی پەروەردگار بفەرموو، هەموو خێرێك لە دەستی تۆدایە.

پێیان دەفەرمویت: ئایا ڕازی بوون؟

ئەوانیش دەڵێن: چۆن ڕازی نابین ئەی پەروەردگار لە کاتێکدا ئەوەی بە ئێمەت بە خشیوە نەتداوە بە هیچ دروستکراوێکت.

پەروەردگار پێیان دەفەرمویت: لەوە باشترتان پێ بدەم؟

ئەوانیش دەڵێن: بۆ لەوە باشتر چیە کە پێتداوین؟

ئەویش دەفەرموێت: ئەوا ڕازی بوونی خۆمم بۆ حەڵاڵکردن وئیتر بۆ هەمیشە لێتان تووڕە نابم.

## سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- قسە وگفتوگۆی نێوان پەروەردگار لەگەڵ ئەهلی بەهەشت پوچەڵکردنەوەی بیروباوەڕی جەهمیەکانە کە پێیان وایە پەروەردگار قسە ناکات.

٢- قسەکردنی پەروەردگار بە دەنگ وحەرفە وبەهەشتیەکان بە گوێی سەریان گوێبیستی ووتەی پەروەردگاریان دەبن.

ئەمەش پوچەڵکردنەوەی بیروباوەڕی ئەشعەریەکانە کە پێیان وایە قسەکردنی خوا بە دەنگ وحەرف نیە.

# فەرموودەی (٣٢)

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ: أَيُّ الذَّنْبِ أَعْظَمُ عِنْدَ اللَّهِ؟ قَالَ: (أَنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ ).قُلْتُ:( إِنَّ ذَلِكَ لَعَظِيمٌ. قُلْتُ: ثُمَّ أَيُّ؟).قَالَ: (ثُمَّ أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ، تَخَافُ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ).قُلْتُ: ثُمَّ أَيُّ ؟ قَالَ: (ثُمَّ أَنْ تُزَانِيَ بِحَلِيلَةِ جَارِكَ).( رواه البخاري: ٧٥٢٠)

## واتای فەرموودەکە:

عبدالله ی کوڕی مەسعود دەفەرموێت: پرسیارمکرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ : چ تاوانێك گەورەترین تاوانە لای خوا؟ فەرمووی: ئەوەی کە هاوەڵ وشەریکی بۆ بڕیار بدەی لە کاتێکدا تەنها الله دروستی کردوویت. وتم بەڕاستی ئەوە تاوانێکی گەورەیە.

وتم پاشان چ تاوانێك؟ فەرمووی: منداڵەکەت لەبار بەریت وبیکوژیت لەترسی برسێتی وخواردن پێدانی.

وتم پاشان چ تاوانێك؟ فەرمووی: ئەوەی کە زینا بکەیت لەگەڵ ئافرەتی دراوسێکەت.

## سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- گەورە ترین تـاوان شـــەریـك بۆ خوا قەراردانە بە هە موو جۆرە وڕەنگەکانیەوە.

٢- لە باربردنی منداڵ لە تاوانە گەورە وجەریمەتە قێزەونەکانە.

٣- زیناکردن لەتاوانە گەورەکانە بەتایبەت ئەگەر لەگەڵ دراوسێدا، چونکە دروانسێ جێگا متمانەی دراوسێیە ومافی گەورەیە.

## فەرموودەی (٣٣)

عَنْ ابن عمر عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (لَا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ، فَهُوَ يَتْلُوهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا، فَهُوَ يُنْفِقُهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ).(رواه البخاري: ٧٥٢٩)

### واتای فەرموودەکە:

عبدالله ی کوڕی عومەر لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: خۆزگەخواستن وچابڕین لە نیعمەتی بەرامبەر دروست نیە تەنها لە دوو شتدا نەبێت: کەسێك خوای گەورە قورئانی پێدابێت وبەشەو ورۆژ سەرقاڵی خوێندنەوەی بێت، وە پیاوێك خوای گەورە ماڵ وسامانی پێدابێت وبەشەو ورۆژ لێی ببەخشێت لە پێناو خوا.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- گەورەترین نیعمەت وفەزڵ کە بدرێت بە کەسێك ئەوەیە کە الله مۆفەقی بکات قورئان لەبەر بکات وهەموو کار سەقاڵی موراجەعەکردن وخوێندنەوە ودیراسەکردنی بێت.

٢- ماڵ وسامانێك کە دەستگیرۆیی فەقیر وهەژارەکانی پێ بکرێت لەدوای قورئان گەورەترین فەزڵە کە بدرێت بە کەسێك.

٣- حەسادەت وچاوبڕینە نیعمەتی خەڵکی لە تاوانە گەورەکانە وتەنها بۆ ئەم دوو جۆرە کەسە دروستە کە جیگای خۆیەتی موسوڵمان خۆزگەیان پێ بخوازێت.



## فەرموودەی (٣٤)

عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ (يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَرَأْسُهُ فِي حَجْرِي وَأَنَا حَائِضٌ).( رواه البخاري: ٧٥٤٩)

### واتای فەرموودەکە:

عائیشە دەفەرموێت پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانی دەخوێند سەری لەسەر کۆشما بوو لە کاتێکدا من لەناو سوڕی مانگانەشدا بووم.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- باشترین کارێك کە موسوڵمان خۆی تێدا بەهرەمەند بکات وهەوڵی لەگەڵدا بدات قورئانە.

٢- لە سۆز وباشێتی پیاو بۆ سوکنایی ڕۆحی خێزانەکەی سەرخستنە سەر کۆشێتی وئەگەر قورئانیش بخوێنێت بەرەکەتدارترە.

٣- کاتی سوڕی مانگانە ئافرەت زیاتر پێویستی بە سۆز وحەنانی پیاوەکەیەتی بۆ هێوربوونەوەی هەڵچونی فکری وساردبوونەوەی گەرمی مێشکی.



## فەرموودەی (٣٥)

عَنْ عَلِيٍّ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ فِي جَنَازَةٍ، فَأَخَذَ عُودًا، فَجَعَلَ يَنْكُتُ فِي الْأَرْضِ، فَقَالَ: (مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ أَوْ مِنَ الْجَنَّةِ). قَالُوا: أَلَا نَتَّكِلُ؟ قَالَ: (اعْمَلُوا، فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ: {فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى}) الْآيَةَ.(رواه البخاري: ٧٥٥٢)

### واتای فەرموودەکە:

عەلی -ڕەزای خوای لێبێت- دەفەرموێت پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ جەنازەیەکدا لە گۆڕستان بوو چیلکەیەکی پێبوو خەت وختوتی پێ دەکرد لەسەر خۆڵەکە وقسەت دەکرد، فەرمووی: هیچ یەکێك نیە لە ئێوە کە شوێنی خۆی لە دۆزەخ یان بەهەشت بۆ نەنوسرابێت.

وتیان: کەواتە پاڵ بدەینەوە وکردەوە نەکەین؟

فەرمووی: نا کردەوە بکەن هەرکەسە چ ڕێگایەك بگرێتە بەر بۆی ئاسان دەکرێت، پەروەردگار فەرموویەتی: هەر کەسێك لە پێناو خوا ببەخشێت وتەقوای ئەو بکات ئەوا کارئاسانی چونە بەهەشتی بۆ دەکرێت.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- لە ئیمان وتەوحیدێکی پاك ئەوە کە باوەڕمان وابێت پەروەردگار زانستی پێشوەختەی نووسراوی بە کاروباری تەواوی دروستکراوەکانی هەیە.

٢- ئەوەی لەسەر بەندەکانە کردەوەکردنە بە فەرمانە شەرعیەکان نەك تەرکی عەمەل وپاڵدانەوە لەسەر زانستێکی پەنهان وغەیبی کە تایبەتی پەروەردگارە.

٣- لە دادپەروەری پەروەردگار ئەوەیە ویست وئیرادەی کردەوەکردن وهەڵبژاردنی چاك وخراپی داوەتە بەندەکانی وزۆرپێکراو نین پێچەوانەی فکری ئەشعەریە جەبریەکان.



## فەرموودەی (٣٦)

عَنْ عَائِشَةَ ﵂ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: (إِنَّ أَصْحَابَ هَذِهِ الصُّوَرِ يُعَذَّبُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَيُقَالُ لَهُمْ: أَحْيُوا مَا خَلَقْتُمْ). (رواه البخاري: ٧٥٥٧)

### واتای فەرموودەکە:

عائیشە -ڕەزای خوای لێبێت- دەفەرموێت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوانەی ئەم وێنە وپەیکەرانە دەکێشن ودروست دەکەن سزادەدرێن لە ڕۆژی دواییدا وپێیان دەوترێت ئەوەی دروستان کردووە زیندووی بکەنەوە.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- لە کەماڵێتی تەوحید وئیمان دوورکەوتنەوەیە لە کێشانی وێنەی ڕۆحلەبەر وپەیکەرتاشین.

٢- خۆچواندن بەخوا لە دروستکردندا، وتەعظیم وبەگەورەدانانی وێنەکێشراو حیکمەتی حەرامێتی وێنەکێشانی ڕۆحلەبەرە، هەرکات یەکێك لەم دوو عیللەتە بوونی هەبوو لەهەر جۆرە ڕەسمێکدا دروست نیە ولە تاوانە گەورەکانە.

٣- وێنەکێشانی پیاوچاکان وپەیکەر بۆ دروستکردنیان لە پێناو بە گەورە ڕاگرتنیان یەکەم هۆکاری سەرەتای بڵاوبوونەوەی شیرك وکوفر بوو، بۆیە لە ئیسلامدا حەرامکراوە.



## فەرموودەی (٣٧)

عَنْ أَبِي مُوسَى رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَالْأُتْرُجَّةِ، طَعْمُهَا طَيِّبٌ وَرِيحُهَا طَيِّبٌ، وَالَّذِي لَا يَقْرَأُ كَالتَّمْرَةِ، طَعْمُهَا طَيِّبٌ وَلَا رِيحَ لَهَا، وَمَثَلُ الْفَاجِرِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الرَّيْحَانَةِ، رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ، وَمَثَلُ الْفَاجِرِ الَّذِي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الْحَنْظَلَةِ، طَعْمُهَا مُرٌّ وَلَا رِيحَ لَهَا).

رواه البخاري: ٧٥٦٠)

### واتای فەرموودەکە:

ئەبو موسای ئەشعەری -ڕەزای خوای لێبێت- دەفەرموێت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نمونەی ئیمانداری قورئانخوێن وەك بەهێ وایە تام وبۆن خۆشە، ونمونەی ئیمانداڕێك قورئان نەخوێنێت وەك خورما وایە تامی خۆشە وبۆنی نیە، ودووڕووی قورئانخوێنیش وەك ڕیحانە وایە بۆنی خۆشە وتاڵە، ودووڕووی قورئان نەخوێنیش وەك گوژاڵکە وایە بۆنی نیە وتامی تاڵە.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- کەلام ووتەی پەروەردگار کاریگەری لەسەر ناخ وڕووی مرۆڤەکان هەیە، بەشێوەیەك کە ڕووی دیاری مرۆڤی دووڕووش جوان وبۆنخۆش دەکات.

٢- قورئان بۆ گۆڕانکاری ناخ وکرداری مرۆڤەکانە وئیصلاحی ناخ ودەروەوەی مرۆڤ دەکات ئەگەر بەراستی سەرقاڵی ببێت.

٣- هاندانی تێدایە بۆ خوێندنەوە وکارکردن بە قورئان ووتە وفەرمایشتی پەروەردگار.

## فەرموودەی (٣٨)

قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂ : سَأَلَ أُنَاسٌ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الْكُهَّانِ، فَقَالَ: (إِنَّهُمْ لَيْسُوا بِشَيْءٍ). فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَإِنَّهُمْ يُحَدِّثُونَ بِالشَّيْءِ يَكُونُ حَقًّا.قَالَ: فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ : (تِلْكَ الْكَلِمَةُ مِنَ الْحَقِّ يَخْطَفُهَا الْجِنِّيُّ، فَيُقَرْقِرُهَا فِي أُذُنِ وَلِيِّهِ كَقَرْقَرَةِ الدَّجَاجَةِ، فَيَخْلِطُونَ فِيهِ أَكْثَرَ مِنْ مِائَةِ كَذْبَةٍ).( رواه البخاري: ٧٥٦١)

### واتای فەرموودەکە:

عائیشـــە -ڕەزای خوای لێبێت- دەفەرموێت: خەڵکانێك پرســیاریان کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی فاڵچیەکان، ئەویش فەرمووی: ئەوانە هیچ نین.

وتیـان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە دەربـارەی شـــتـانێـك قســـەدەکەن ڕاستیش دەردەچێت.

پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە قسەیەکی حەقە جنۆکە دەیدزێت ودەیدات بە گوێی دۆستە فاڵچیەکەیدا، وەك قوقە ودەنگی کەڵەشێر، فاڵچیەکەش سەد درۆ زیاتری تێکەڵ دەکات.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- پەروەردگار بە حەرف ودەنگ قسە دەکات وفەرمان دەردەکات ومەلائیکەتەکان گوێیان لێی دەبێت وباسی دەکەن لە نێوان خۆیاندا وهەندێك جار جنۆکەکان بەرزدەبنەوە بۆ ئاسمان بۆ گوێبیستبوونی

قسەیەکی ئەهلی ئاسمان تا بیهێننەوە بۆ دۆستەکانیان لە فاڵچی وجادووگەرەکان.

٢- فاڵچی وجادووگەرەکان درۆزنترین خەڵکن، موسوڵمان نابێت باوەڕیان پێ بکات وبچێتە لایان وپرسیاریان لێبکات.

٣- بەرزبوونەوەی جنۆکەکان بۆ گوێبیست بوونی قسەیەکی حەقی ئەهلی ئاسمان بەڵگەی سیفەتی بەرزێتی زاتی الله یە کە لە ئاسمانە لەسەر عەرشەکەی.



## فەرموودەی (٣٩)

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (يَخْرُجُ نَاسٌ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ، وَيَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، ثُمَّ لَا يَعُودُونَ فِيهِ حَتَّى يَعُودَ السَّهْمُ إِلَى فُوقِهِ). قِيلَ: مَا سِيمَاهُمْ؟ قَالَ: (سِيمَاهُمُ التَّحْلِيقُ). أَوْ قَالَ: (التَّسْبِيدُ).(رواه البخاري: ٧٥٦٢)

### واتای فەرموودەکە:

ئەبو سەعیدی خودری -ڕەزای خوای لێبێت- دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: خەڵکانێك لە ڕۆژهەڵاتەوە دەردەچن قورئان دەخوێننەوە لە قورقوڕاگەیان تێپەڕ ناکات -ناچێتە دڵیان ولێی تێبگەن- لە دین دەردەچن وەك چۆن تیر لە کەوان دەردەچێت، -بەشێوەیەك دەردەچن کە- جارێکی تر ناگەڕێنەوە ناوی هەتا کاتێك تیر دەگەڕێتەوە ناو کەوانەکەی.

وترا: شکڵ وسیمایان چۆنە؟ فەرمووی: سیمایان ئەوەیە هەموو کات سەریان دەتاشن یان فەرمووی: سیمایان ئەوەیە کە قژی تر دەلکێنن بە سەریانەوە وگوێ بە پاك وخاوێنی خۆیان نادەن.

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- قورئان کتێبێکە دووڕووەکان وبیدعەچیەکانیش دەتوانن بیخوێننەوە، بەڵام دڵیان لێی تێناگات ونایانگۆڕێت بە هۆکاری پیسی وژەنگی سەر دڵەکانیان کە پاکی ناکەنەوە.

٢- خەوارجەکان قورئانخوێن وئەهلی زوهد وعیبادەتن بە ڕووکەش بەڵام هەڵگری فکر وبیروباوەڕی چەوت ولارن، کەواتە مەرج نیە ئەوەی قورئانی لەبەر بوو یان ڕووکەش ئەهلی عیبادەت وزوهد بوو ئەوە پێوەری باشێتی وچاکێتی بێت.

٣- لە سیفەت وفکری خەوارجەکان ئەوەیە کە:

- موسوڵمانی نوێژ خوێن کە هەڵگری هیچ کوفر وشیرکێك نەبێت بە تاوان تەکفیر دەکەن.

- باوەڕیان بە شەفاعەت نیە بۆ تاوانباران، پێیان وایە هەرکەس چوویە دۆزەخ دەرهاتنەوەی نیە.

- باوەڕیان بە حوکمی ڕەجمی زیناکار نیە.

- فەرموودە وئیجماعی سەلەف بە سەرچاوەی وەرگرتنی عەقیدە ودین نازانن.

- هەر کەس لەگەڵیان نەبێت وپشتگیر وسەرخەریان نەبێت بە دوژمنی دەزانن وبەڕائەتی تەواوی لێدەکەن، ووەلاء وبەڕائیان لەسەر ئەساسی فکر وڕێگاکەی خۆیانە نەك لەسەر ئیسلام وتەوحید.

- توند و ڕەقن بەرامبەر ئەهلی تەوحید وئیمان لەبەرامبەردا ئەهلی کوفر لە دەست وزوبانیان سەلامەتە.



## فەرموودەی (٤٠)

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ : (كَلِمَتَانِ حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ، خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ، سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ).( رواه البخاري: ٧٥٦٣)

### واتای فەرموودەکە:

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێبێت- دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: دوو ووتە هەن خۆشەویستن لای خوای میهرەبان، ئاسانن لەسەر زوبان، قورسن لە تەرازووی قیامەتدا، (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ).

### سوودە هەڵبژێردراوەکان لە فەرموودەکە:

١- پەروەردگار سیفەتی خۆشویستنی هەیە چی بوێت لە کەس وشت وکات وشوێن خۆشیدەوێت.
٢- لە تەوحید وئیمانێکی ڕاســت، ئیمانە بە تەرازوویەکی حەقیقی لە ڕۆژی دواییـدا کە خۆمـان وکـاروکردەوەکـانمـانی پێـدەکێشـرێـت، تەرازوویەك دوو تا وزوبانێکی هەیە.

**وصلى اللّه وسلم على نبينا محمد واله وصحبه وسلم**

تمت

# ناوەڕۆك

# ناوەڕۆك